# ئاسەوارەکانی تاوان و گوناه



نووسینی

مامۆستا محی الدین رشید گەلالی



پیداچوونەوە و ریکخستنی

رزگــــار کریــم

چاپی یەکەم

١٤٢٠ ك - ١٩٩٩ ز

# ئاسەوارەکانی تاوان و گوناه

نووسینی
مامۆستا محی الدین رشید گەڵاڵی

پێداچوونەوە و ڕێکخستنی
رزگار کریم

چاپی یەکەم

١٤٢٠ ك - ١٩٩٩ ز

بسم الله الرحمن الرحيم


❶ ناوی پەڕاو: ئاسەوارەکانی تاوان و گوناه

❷ نووسینی : محی‌الدین رشید گەلالی

❸ پێداچوونەوە و ڕێکخستنی: رزگار کریم

❹ چاپی یەکەم

❺ ساڵی چاپ : ١٤٢٠ ك - ١٩٩٩ ز

❻ کۆمپیوتەر: نوعەیم حبیب محمد

❼ چاپەمەنی و ئۆفسێتی پەیڤ

❽ ژمارەی سپاردنی (٨٠٢) دراوەتێ.

## پێشەکی نووسەر:

تاوانەکان نوکتە و ئاسەواری خۆیان دەخەنە سەر دڵ و لاشەی گوناھبار لە دونیا و قیامەتدا بەرەنگدانەوەی لەسەر رەوشت و ھەڵسو کەوتەکانی مەردم لە دنیادا و بەرکەوتنی غەشم و قین و سزای پەروەدگار لە قیامەتدا.

تاوان ستەمێکی گەورەیە مرۆڤ لە بەرامبەری خوای گەورە و خۆی و خەڵکیدا ئەنجامی ئەدا ھەر بەھۆی تاوانەوە سنوورەکانی خوا دەبەزێنێ و لە زەلکاوی حەرامدا رۆدەچێت و دڵی کەڕ و گوێی کاس دەبێت لە ئاستی بانگەوازی حەق و راستی دا و لەئەنجامدا، مافی خەڵکی پێشێل دەکات و نەفسی خۆشی و بە فەوتان دەبا و سروشتی پاکی لە کەدار و پیس دەکات، جا بۆ ئەوەی مرۆڤ ھەمیشە بێدار و زرنگ بێت و ئاگاداری فرو فێڵەکانی شەیتان و نەفسی بێت وا پێویست دەکات زیانەکانی تاوان و دەرەنجامە خراپەکانی بزانێت و ھەوڵ بدات خۆی دوورە پەرێز بگرێت لەوتاوانانە بە

ئومێدی رزگار بوونی و رێنومایی كردنی خەڵكی بۆ رێگای راست و رەوانی خواناسی.

بۆیە بەباشم زانی لەم دەرفەتەدا تیشك بخەمە سەر ئاسەوارەكانی گوناه و تاوان و بە كورتی بۆ خوێنەری بەرێزی روون بكەمەوە ، داواكارم لە خوای گەورە پەناو پشتیوانی هەموان بێت بۆ دوور كەوتنەوەمان لە گوناه و تاوان و شاد بوونمان بە بەهەشتی بەرین..

**م . محی الدین رشید گەلالی**

## پێناسەی تاوان و گوناه

تاوان لە زمانەوانیدا بە مانای ( إثم) هاتووە[1]

هەروەها راغیبی ئەصفەهانی دەفەرموێت :( الذّنوب: الفرس الطويل الذنَب ،و الدّلوَ التي لها ذَنب...... و الذَنبَ في الأصل: الأخذ بذنب الشيء....)[2]

واتە: (ذنوب) بەو ئەسپانە دەوترێت کلکیان هەیە یان بەو دۆلچەیە دەوترێت کە ئاوی پێ هەڵ دەگۆزرێت لە بیردا لە بناغەشدا بەواتای گرتن و لۆمەکردن بەهۆی تاوانێکەوە هاتووە))

بەڵام زانایان لەسەر ئەوە کۆکن تاوان بریتیی یە لە شکاندنی سنورەکانی خوا یان هاندانی نەفس لە لایەن شەیتانەوە بۆ گوناه و سەرپێچی کردن و هاوەڵ پەیدا کردن. و

[1] ترتيب قاموس المحيط بەرگی ٢/ لا٣٦٩.

[2] مفردات ألفاظ القرآن لراغب الأصفهاني لا ٣٣١.

شایستە بون بەسزا و غەشم و قینی خـوای ،[٢] كەواتە تاوان گوێ نەدانەبەو دەق شەرعیانەی لە قورئان و سوننەت داھاتورن و رێ و رەسمی ژیانی مرۆڤی موسڵمان دیاری دەكەن و سەرەنجامی پێچەوانەی ئەوە دەقە شەرعیانە بجوڵێتەوە

[٢] بنوار كتاب الفواعد ـ للأمام بن قیم الجوزیة لا ٨٠.

## ئاسەوارەکانی تاوان ( گوناه ) لەسەر بوارە جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤ.

خوای گەورە بەشێوازێک مرۆڤی دروست کردووە کە چەندەها بواری جۆراو جۆر و جیاواز لە ناخ و پێکهاتەی دا دروست کراوە بۆیە مرۆڤ لە دڵ و عەقڵ و بیرو لاشە ... هتد پێکهاتووە و هەرەیەکیش لەم ئەندام و پێکهاتانەی ناو ناخی مرۆڤ لە کاتی روودانی تاواندا کاریگەر دەبن بەپێی رێژەو ئاستی تاوانەکە، بۆ زیاتر رونکردنەوەی بوارەکان و پەیوەست بونی هەریەک لە تاوانەکان پێوەی وا لە خوارەوە باسیان دەکەین

## یەکەم/ لەسەر نەفس و دڵی مرۆڤ:

نەفسی مرۆڤ بەشێوەیەك دروست کراوە حەز لە سەرپێچی و گوێ نەدان دەکات بە فەرمان و ئەرکەکانی خوایی گەورە ئەو ئەوکاتەی دەیخاتە ئەستۆی مەردومەوە هەمیشە پەیمانی درۆینە ئەدات بە مرۆڤ و حەز دەکات پێی دڵ هەڵخلیسکێ:

هی النفس ان ساعحتها رمت بك في مهاوي الخديعة
فلا تجبأنَ بميعادها فميعاد ها كسراب بقيعة[4]

واتە: ( ئەگەر چاو بۆ شی بکرێت لە نەفس و گوێی بێ نەدەیت فریوت ئەدات و هەڵت دەخەڵێتێنی لەبەر ئەوەی بەفریوی مەچۆ و گوێ بۆ پەیمانەکانی مەگرە چونکە پەیمانەکانی وەك ئاوی درۆینەی بیابان وایە کاتێ مرۆڤ تینوی دەبێت لە دوورەوە وا دەزانێ ئاوە بەڵام هەر کە نێزیکی کەوتەوانێ راستی ئەو چاو بەستەی بۆ روون دەبێتەوانێ

[4] منهج الأسعاف.

کەواتە نەفس هانی مرۆڤ دەدات بەرەو خۆشیەکانی دنیا هەنگاو بنێ و لانەکاتەوە بەلای دروستی ئەو خۆشیانە یان نادروستی و حەرامیان باجی ئەم سەر پێچیانەش لەسەر نەفس خۆی دەکەوێت و ئاسەواری سامنام و کاریگەری لێ دەکەوێتەوە لەو ئاسەوارانەش:

١ـ تاوانکار لە ئەنجامی تاواندا دەکەوێتە بارێکی دەرونی ئاڵۆز و هەست بە بوونی بۆ شاییی دەکات لە رۆحیدا هەرەچەندە ماڵ و سامان و هۆکارە پێویستەکانی ژیانیشی دا بین کرا بێت هەستێکە لەناخەوە دروست دەبێت و خاوەنەکەی ناتوانێ لە بیری خۆی بباتەوە بەڵکو باڵی رەشی تاوان بەسەریا درێژ دەبێت و غەم و پەژارە بە روویا دیاری ئەدات خوای گەورەش ئاماژەی کردوە بۆ ئەم ئاسەوارە و لە ئایەتێکدا دەفەرموێت : ( ومن أعرض عن ذكري فأن له معيشةً ضنكما و نحشرة يوم القيامة أعمى). طه:١٢٤.

واتە: ( ئەوکەسەی نکولی بکات لە گوێ رایەڵی کردنی پەروەدگارا ژیانێک دەباتە سەر لە هەموو جۆرەکانی خۆشی دا ماڵ راوە و هەست بەتام و لەزەتی خۆشی ناکات).[٥]

٢ـ بەهۆی تاوانەوە دوورەپەرێزی و نامۆیی یەک دەکەوێتە نێوان خەڵک و تاوان کارەوە چونکە رەفتار یان لەیەک ناچێت و بۆ چوون و دیدیان جیاوازی تیایە بۆ نموونە جاری وا هەیە حەز ناکات چاکە خوازان ببینێ یان هاوکار و هاوەڵیان بکات بەمەش حاڵەتێکی نەفسی ئاڵۆز روودەکاتە خاوەنەکەی و هەمیشە دوورەپەرێز دەبێت لە چاکە کاران و پەنجەی تاوان بۆ خزمەت گوزار و بانگخوازانی ئەم رێگایی رادەکێشێ ئیمامی شافیعی ـ رەحمەتی خوای لێ بێ ـ دەفەرموێت: ئەگەر نەفسی خۆت سەرقاڵ نەکەیت بەحەق و راستیەوە ئەوا ئەو تۆ سەرقاڵ دەکات بەشتی هیچ و کەم بەهاو کەم نرخەوە..[٦]

[٥] تەفسیری مقتطف. لا ٥٧٩

[٦] الرقائق لمحمد احمد راشد.

٣ـ دڵی تاوانكار تارمایی دایدەپۆشێت هەروەكو لەشەودا هەست بە تاریكی شەو دەكەیت و رەشبینی بەر لە چاو گوێ و هەستەكانی تری دەگرێت تا خاوەنەكەی بەردەوام بێ لەسەر خراپەكان زیاتر شپرزەو گومرا بێ و ئاسەوارەكانیشی لە سەر سیماو ووتەكانی دەردەكەوێت (كلا بل ران علی قلوبهم ماكانوا یكسبون) المطففين/١٤.

واتە: نەخێر قورئان پروپاگەندەو ئەفسانەنی یە بەڵكو دڵی ئەوانەی سنوریانی شكاندوەو بێ باوەڕیان هەڵ بژاردووە پەردەی لەسەر دروست بوە بەهۆی ئەو سەرپێچی و گومراییەوە كە كردویانە.[٧]

٤ـ تاوانەكان دڵی تاوانكار لاواز دەكات بەشێوەیەك بە تاوان زیندوێتی لەدەست ئەدات بەرەو بێ ئاگایی و سستی و مردن دەچێت و لاواز دەبێت لە بەجێ هێنانی ئەركەكانی شەو رۆژدا لەو بارەیشەوە دەگێرنەوە جارێكیان پیاوێك پرسیار دەكات لە حەسەنی بەسری ـ رەحمەتی خوای لێ بێت

[٧] تەفسیری مقتطف لا ١٣٠٨

- دەڵێت : باوکی سەعید من ئێواران لەش ساغم و حەز لە شەو نوێژە دەکەم کاتێکیش دەنووم بە دەست نوێژەوە دەنوم ، بۆچی ناتوانم هەستم؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێت : گوناه بە ستویتیەوە.[٨]

هەر لەو بارەیەشەوە ئیبن قەییم دەفەرموێت ( هەموو گوناهەکان دەبنە هۆی بێ بەش بوون لە گوێڕایەڵی ، ئەگەر گوناه هیچ سزایەکی بەدواوە نەبوایە جگە لە بێ بەش بوون زیاتر ئەوا جێگەی دەگرتەوە بە گوناهێک ڕێگەی گوێڕایەڵی دەگرت و ئیتر یەک لە دوای یەک... بەو تاوانانە ڕێگەی جێ بەجێ کردنی هەموو فەرمانەکانی خوا دەگیرێت کە هەریەکێکیان لە دنیا و خۆشی یەکانی زۆر باشترە...[٩]

٥ـ زۆری و بەردەوامی لەسەر تاوانەکان پەردەی دڵی خاوەنەکەی قاییم و ڕەش دەکات هەتا وای لێ دێ خراپەکانی

---

[٨] بنوارە ـ أحياء علوم الدين ١/٣٥٦.

[٩] بنوارە الداء و الدواء أو الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافيي لأبن قيم.

لا سادە دەبێت و پەردەی شەرمی نامێنێ لەگەڵ تاك و كۆمەڵدا و بەئاشكرا و نەهێنی شانازیبە تاوانەكانییەوە دەكات و دەڵێت: وام كردووە واچووم و ... هتد بەرادەیەك داوادەكات گوێ بیست و هاوەڵانی كە ئەوانیش هەڵوێست و رەفتارەكانی ئەم بگرنەبەر خوای گەورەش نەفرەت و خەشم و قینی ئاراستەی ئەوانە دەكات كە شانازی دەكەن بە گوناە و تاوانەوە و پێغەمبەریخوا ﷺ دەفەرموێت : خوای گەورە لەهەموو ئوممەتی من خۆش دەبێت تەنها ئەوانە نەبێت كە بە ئاشكرا گوناه و تاوان دەكەن بەراستی ئەو ئاشكرا كردنە كارێكی خراپە چونكە كاتێك مرۆڤێك بە شەو كارێك بكات و خوای گەورە دایپۆشێت بەڵام خۆی جاڕی بۆ بدات و بڵێت: دوێنێ شەو ئەو كارەم كرد ئەمە كارێكی نادروستە).[١٠]

٦ـ یەكێكی تر لە سزاكانی تاوانكردن ئەوەیە دڵ لاواز و تەمبەڵ دەبێت لە هەنگاوەكاریداو بەر بەست و كۆسپ و كۆتی زۆر دێتە ڕێی و هەمیشە بە گومان و دڵە راوكێ وە

---

[١٠] رواه مسلم.

ڕێگا دەبڕێ ئیبن قەییم لەو بارەیەوە دەفەرموێت : نەفس کێوێکی مەزنە لە ناو ئەو کێوەدا ڕێگر و کۆسپ و دڕک و داڵ و جەردە هەیە ئەگەر مرۆڤ توێشووی باوەڕی بێ نەبێت و بەچرای یەقین و گەڕانەوەی هەمیشە وزە وەرنەگرێ لەت و پەت دەکرێن و لەبارێکی دەروونی گراندا دەمێنێتەوە و لە ڕێگادا دەوەستێ و ناتوانێت هەنگاو بنێ بەرەو پێش.[١١] لە ئەنجامدا نەخۆشی هەمەچەشن دیاری ئەدات لەو نەخۆشیانەش :

آ. غەم و پەژارە .

ب. لاوازی و نەتوانین .

ج . تەمبەڵی و خۆدواخستن .

د. بەخیلی و حەزکردن لە داماڵینی ناز و نیعمەت لە خەڵکی و بێ بەش کردنیان.

هـ . لاوازی لەبەندایەتی و پلەو پایەکانیدا.

و. هەڵچون و گرژی باری دەرونی مرۆڤ.

---

[١١] بنواڕە تهذيب مدارج السالكين منزلة ، الأخبات / بەرگی ١ لا ٤٥٠.

هەریەك لەم نەخۆشیانەش بەڵاو دەرەنجامی خراپیان لیّ دەكەوێتەوە لەو دەرئەنجامانەش:

آ. بەدبەختی و گرتنەبەری رێگای خوانەناسان.

ب. هاتنە ریّی ئەو بەلایانەی لە تاوانەوە دەكەوێتەوە.

ج. دڵخۆش بونی دوژمنان لە شكستی ئەو مرۆڤە.

٧ـ لەئەنجامی بەردەوام بوون لەسەر تاوانەكانی نەفسی خاوەنەكەی ترسنۆك و لەرزۆك و بیّ ئیرادە ئەكات وەك چۆن بەنی ئیسرائیل ترس وبیم دای گرتن كاتیّ رووبەرووی دوژمنان بونەوانیّ و وتیان بە موسا ـ سەلامی خوای لیّ بیّت ـ ( **قالوا يا موسى أنا لن نُدخلُها أَبدا ماداموا فيها فاذهب أَنت وربك فقاتلا إنا ها هنا قاعدون)** المائدة /٢٤.

واتە: موسا.. لەو شارەدا پادشاو دەسەڵاتداری بەتوانای تیایە و ئێمە ناتوانین بەرەنگاریان ببینەوە لەبەر ئەوە ناچینە ناو شار تا ئەوان نەیەنە دەریّ كاتێك شار یان بەجیّ هێشت ئەوسا دەچین....!!!)[١٢] ٨ـ یەكێكی تر لە ئاسەوارەكانی تاوان

[١٢] تەفسیری مقتطف ـ لا ١٨٦.

مرۆڤی تاوانبار خاوەنەکەی ئامۆ دەکات لەگەڵ خۆیو خواو خەڵکیدا و هەمیشە بەچاوی دوژمن و نەیارەوە بۆ بەرامبەرەکانی دەڕوانێ و هەروتەو کردارێک یان لێ ببینێ و ببیستێ بە هەڵە لێکی دەداتەوە و بەتەواوی شەیتان زاڵ دەبێت بەسەریا وخوای گەورەش زیاتر وێڵی دەکات (فلماذا زاغوا أزاغ ا لله قلو بهم وا لله لا يهدى القوم الفاسقين) الصف / ٥.

واتە: کاتێک پشتیان هەڵکرد لە گوێ رایەڵی خوای گەورەش دڵی لادان لە رێنومایی و چون بەرەو هەق لە ئامێز گرتنی بێگومان خوای گەورە نەتەوەیەک لە رێنومایی ناکات لەحەق و راستی لایان دابێت..[١٣]

٩ـ بەهۆی تاوانەکانەوە دڵ تەندروستی و سروشتی پاکی خۆی لە دەست دەدات و شپرزە و پەشۆکاو دەبێت تەنانەت سوود وەرناگرێت لە خواردن و خواردنەوە و خۆشیەکانی تری دنیا چونکە کاریگەری نەخۆشیە کانی دڵ پەیوەستن بە

[١٣] تەفسیری مقتطف لا ١٠٩٣.

ئەندامەکانی تری لاشەوە ھەرکات مرۆڤ باری دەرونی ئاڵۆز و ناتەواو بوو باری تەندروستی نارێک دەبێت لەو بارەیەوە زانایەکی فەرەنسی دەفەرموێت: ( ئەوانەی بەندایەتی دەکەن و سەردانی جێگاکانی بەندایەتی دەکەن گرفتی نەفسیان نی‌یە..)

١٠ـ یەکێکی تر لە سزاکانی تاوان ئەوەیە فراسەت (پێشبینی) و نوری دڵ کز دەبێت و رێگای وەرگرتنی زانست و زانیاری لێ دەگیرێت و هۆکارەکانی رێنومای لێ تەسک دەبێتەوە لە ئەنجامدا بێ بەش دەبێت لە هۆشیاری و زرنگی لەو بارەشەوە ئیمامی تورموزی فەرمودەیەکی مەوزوع دەهێنێت کە دەفەرموێت: (أتقوا فراسة المؤمن فأنه ينظر بنور الله ) . واتە: (خۆتان بپارێزن لە فیراسەتی باوەڕدار چونکە بە نوری خوا دەروانێت).

١١ـ یەکێکی تر لە ئاسەوارەکانی تاوان لەسەر نەفس و دڵ ئەوەیە خاوەنەکەی هەمیشە لەژێر کاریگەری شەیتان و ئارەزووە ناپەسەندە کانیدا دەبێ و دەبێت بە کۆیلەی حەز و

ئـارەزووە ئاژەڵیـەکان و ئـازادی خـۆی لەدەسـت دەدات کەسێکیش لە ژێر کاریگەری ئـەو دوو دوژمنـە دا بێـت چۆن دەتوانێت خۆی لە کۆت و بەندی دابڕ کۆیلایەتی نیّ؟ ئـارەزوو شـەیتانیش پێکـەوە بۆسـەو نەخشـەی نابـەجێ گـریێ ئـەدەن دەرحـەق بـەو جـۆرە کەسـانەش پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرموێت: ( وإنه سيخرج من أمتي أقوام تجاري بهـم تلـك الأهواء كما يتجاري الكلب لصاحبه)[١٤]

واتە: لەناو ئومەتی مندا گرۆیەن پـەیدا دەبـن ئارەزوو دەیـان بات بەرێوە هەروەک چۆن سەگ خاوەنەکەی دەیبات بەرێوە).

ئەوانەی ئەمە حاڵیان بێت قەدرو ڕێزیـان نـامێنێت و سـەر لێشێواو دەبن ( ومن أضلّ ممن اتبع هواه بغير هـدى مـن الله) القصص :٥٠. واتە: جا کێیە گومڕا تر بێـت لـەو کەسـەی کـە ئەکەوێتە شوێن هەوای خۆی و بەبێ ئەوەی بەڵگەی کی هـەبێ لە کتێبێکی پیرۆزکە لەلایەن خوداوە هاتبێت)[١٥]

---

[١٤] رواه أبوداود و هي جزء من حديث طويل ١٩٨/٤ رقم ٤٥٩٧.

[١٥] تەفسیری نامی بەرگی پێنجەم لاپەڕە ٥٠٩.

١٢٥ـ یەکێکی تر لە سزاکانی تاوان بۆ خاوەنەکەی ئەوەیە هەموو شەیتان و فریشتە و مرۆڤێک پێی دەوێرن و سامیان لێ ی دەشکێ هەتا وەکو خزمەت گوزار و ئاژەڵەکانی دەوو بەریشی ئەو ترس و ویقارە یان نامێنێ بۆی و ئازارو ئەشکەنجەی ئەدەن ، وە بە ئاسانی فرسەتی لێ دەهێنن و بەدەم بانگ و قسەکانیانەوە ناچن چونکە ترسان لە خوا ئارەزووکان دەسوتێنێ و سەرپێچی و تاوانەکان دەبێتە جێگەی رق و کینی خاوەنەکی[١٦] و بە پێچەوانەشەوە.

١٣ـ زۆری تاوانەکان دەبنە هۆی کزی و لاوازی غیرەتی شەرعی و کەسایەتی خاوەنەکەی سوک و ریسوا دەکەن چونکە لەهەرتاوانێکەوە بۆ یەکێکی تر زیندوو و هەستیاری دڵ لە دەست دەچێت هەتا وای لێ دێت تێروانینی هەڵە لەدایک دەبن لەدڵ و دەروونی خاوەنەکەی داو چاکە لە جێگای خراپەدا دەنێت و باسەکان هەمووی پێچەوانەی یەکتری دەوەستێت هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت

[١٦] بنوارە تزكية النفوس ـ ترتيبها كما يقرره علماء السلف / لا ١١٧.

: ( ما أحد أغْبر مِن الله ومن غيرته: حرم النواحش ما ظهر منها ما بطن وما أحدا أحب اليه لمدح مِن الله ومن أحل ذلك: أثنى على نفسه وما أحد أحب اليه العُذر من الله من أحل ذلك : ارسل الرسل مبشرين و منذرين).[17]

واته: هیچ کەسێک ئەوەندەی پەروەدگار غیرەتی نی‌یە وە لە راستگۆی ئەو غیرەتەیە خراپەی ئاشکراو نادیاری حەرام کرد وە، هیچ کەس ئەوەندەی خوای گەورە مەدج و پیا هەڵدانی بۆ خۆش نی‌یە بۆیە سەنای خۆی کردووە وە کەسیش ئەوەندەی ئەو ئەو بەهانەی بۆ خۆش نی‌یە لەو پێناوەشدا پێغەمبەرانی ناردوە تا بەهانەی خەڵکی ببڕێت.

١٤ـ بەهۆی تاوانەوە مرۆڤ شەرمەزار و کز دەبێت و هەرەچەندە هەوڵ دەدات لەو پایەو پلەیەدا دەرنەچێت چونکە دەست گرتن بە ئاینی خواو پارێزگاری کردن لە سنورەکانی سەربەرزی و عیزەت بە مرۆڤ دەبەخشێت (من كان يريد العزة فلله العزه جميعاً) فاطر : ١٠.

[17] رواه البخاری و مسلم و اللفظ المسلم

واتە: ئەو مرۆڤەی دەیەوێت ڕێزدارو سەربەرز و بەهێز بێت با گوێ ڕایەڵی خوا بكات چونكە خوای گەورە خاوەنی هەموو هێز و توانایە كە.[18]

## دووەم / لەسەر عەقڵ و ژیری مرۆڤ

عەقڵ و ژیری مرۆڤ ئەگەر بە پاكی بەگەر بخرێت ئەواهەمو شتێكی بەسوود وەردەگرێت و مرۆڤ دەخاتە پلەو ئاستێكی بەرزەوە و گەردوون ملكەچی ئەو دەبێت بەڵام ئەگەر مرۆڤ عەقڵ وە لانێت و گوێی پێ نەدات دەبێت بە سەرچاوەی كاری خراپ و تاوانەكانیش لەهەڵس و كەوتیدا دیاری دەدات ئەوشوێنەوارانەش بریتین لە:

١. تاوانكار بێ بەش دەبێت لە زانیاری و زانستی سوود مەند چونكە ئەو جۆرە زانیارییانە كاتێك مرۆڤ بەدەستی دەهێنێت عەقڵی وە بەربخات و لەژێر كاریگەری گوناه و

[18] تەفسیری مقتعطف ـ لا٨٣.

تاوان قوتاریێت لەوبارەیەوە ئیمامی شافیعی باسی خۆی دەكات كە چۆن ماوەیەك بێ بەش بو لە زانست و تووشی لە بیرچوونەوە بوو بەهۆی تێڕوانینێكی نادروست ئەم چیرۆكەش لە دووبەیت شیعردا بۆمان دەگێڕێتەوە:

شكوت الى ابن وكيع سوء حفظي

فأرشدني الى ترك المعاصي

وأخبرني بأنَ العلم نور

ونور الله لا يهدى لعاص[19]

واتە: خراپی لەبەركردنم خستەبەرچاوی ئیبن وەكیعی مامۆستام ئەویش پێ وتم: واز لە گوناه و تاوان بهێنە چونكە زانیاری نورو رووناكیە خواش بە نوری خۆی رێنومایی ئەوانە ناكات كە سەرپێچی دەكەن).

٢ـ تاوانەكان وردی و سەلیقە و هۆشیاری عەقڵ تێك ئەدەن چونكە عەقڵ بەرەنجامی زانینی بەسوودە و لە كۆتاییدا خاوەنەكەی گوێ و چاوی لە كاردەبێت و بە

[19] ديوان الأمام الشافعي.

راشکاوی دەڵێن (لو کنا نسمع أو نعقل ماکنا في أصحاب السعیر). ملك : ١٠

واتە: ئەگەر گوێمان لە حەق بگرتایەو وبیرمان لێ بکردایەتەوە نەدەبووین بە ئەهلی دۆزەخ.[20]

٣ـ مرۆڤی تاوانکار هەرکە عەقڵی لەکار کەوت ئیتر تووشی بێ ئاگایی و ـ غافڵ ـ بونیدێت و لە جیهانێکی پرهەست و نەستەوانێ مرۆڤ دەچێت بەرەو بێ ئاگایی و لەدەست چوونی هەستەکانی کە خوای گەورەش قەدەغەی کردون کە مرۆڤ وا بێت ( ولا تکن من الغافلین) البقرة: ١٩٧

واتە: لە بێ ئاگاکان مەبە لە زۆربەی ساتەکانی تەمەنتا.[21]

٤ـ یەکێکی تر لە سزاکانی تاوان کەمی سوکایەتی دەهێنن بەسەر هۆش و عەقڵی مرۆڤ دا چونکە عەقڵ خۆی دروستکراوە و قوتابی و بەندەی خوایی گەورەیە هەرکەسیش

---

[20] تەفسیری مقتطف ـ لا ١١١٧.

[21] تەفسیری مقتطف ـ لا٧٩٧.

زیاتر ملکەچ و پابەندی بڕیارەکانی خوابێ ئەوە عەقڵی زیاتر گەشەئەکات بەهرەمەند و چالاکتر دەبێت ( واتقوانـي يا اولي الألباب) البقرة : ١٩٨.

٥ـ لە ئەنجامی بەردەوام بوون لەسەر تاوان ئەوا ئەندامەکانی لەش هەستیار و بێ هەست بڕیار ی دژایەتی ئەدەن بەڕادەیەک عەقڵیشی دەگرێتە و وە حەقی لێ دەکات بە ناحەق و ناهەقیش بە حەق چونکە هەموو ئەندامەکانی لاشە حەز بە گوێ ڕایەڵی دەکەن و نیگەرانن بە تاوان و گوناه کردن : ( اليوم نختم على أفواههم و تكلمنا أيديهم و تشهد ارجلهم بما كانوا يكسبون).يس :٦٥

واتە: ئەمڕۆ ڕۆژی قیامەت ـ مۆر دەدەین لە دەمیان ناتوانن هیچ وشەیێک بدرکێنن ئینجا دەست و قاچیان دەهێنە قسەو گفتوگۆ لەسەر کردارەکانیان).[٢٢]

---

[٢٢] تەفسیری مقتطف ـ لا٨٤٠.

## سێیەم/ لەسەر رەوشت و ھەڵسوکەوت وتەمەنی مرۆڤ

مرۆڤی تاوانبار رەوشت و ھەڵس و کەوتیشی تێک دەچێت ئەوانەی لەگەڵیدا ژیان دەبەنە سەریان لە کۆمەڵدا بەدی دەکەن بە ئاسانی ھەست بە تاوانباری ئەو مرۆڤە دەکەن و بە چاوێکی پڕ لە غەشم و قینەوە بۆی دەڕوانن چونکە ھەڵس و کەوتەکانی پێچەوانەی سروشتی پاکی مرۆڤایەتییە لەو شوێنەوارانەی تاوان کردن لە سەر رەوشت و ھەڵسوکەوتی مرۆڤ بەجێی دەھێڵێ چەن خاڵێکی گرنگن وا لەخوارەوە باسیان دەکەین :

١ـ تێزیک کردنەوەی تاوانبار بەبەردەوامی لە کەم ڕێزیو کەم متمانەبوونی خەڵکی پێی وای لێ دێت کەس متمانەی پێ ناکات و ھەمیشە جێگەی مەترسی دراوسێو کەس و کار میللەت و مرۆڤە دڵسۆزەکان دەبێت تەنانەت ئەو مرۆڤە خۆشی ھەست بەو خراپەیە دەکات کە لەسەر نەفسی کۆ بوەتەوە بەڵام بەھۆی رەش بونی دڵیەوە ناتوانێت جوڵە

بکات پێغەمبەری خواش ﷺ ئاماژەی بەو خاڵە کردوە بۆیە کاتێ باس لە بەشودانی کیژۆڵەکان دەکات دەفەرموێت : بیدەن بەوانەی دیندارن و رازین لە هەڵسوکەوتیان.[٢٣]

٢ـ تاوانکار بێ وەفای زاڵ دەبێت بەسەر هەڵوێستەکانیدا لای خەڵکی بە مرۆڤێکی سپڵەو شەڕگێڕ دەدرێت لە قەڵەم و ناونیشانێکی خراپە و خەڵکی بۆ خۆیانی هەڵ دەبژێرن ( بئس الأسم الفسوق بعد الأيمان). الحجرات:١١.

واتە: خراپترین و ناشیرین ترین رەوشت باوەڕداران دوایی ئەو باوەڕەی هێناویانە کردار و رەفتاریان بەو شێوازە بێت..[٢٤]

٣ـ تاوان کردن دەبێتە هۆی وروژاندنی دوژمنی مرۆڤ و شەرمەزاری دەهێنێت بەسەری دا کە لە هیچ رویەکیشەوە ئەو بارە ناگونجێ لەگەڵ کەسایەتی و حەز و ویژدانی مرۆڤ دا :(وإن الشياطين ليوحون الى أوليائهم يجادلوكم وان اطعتموهم إنّكم لمشركون) الأنعام :١٢١.

---

[٢٣] تەفسیری مقتطف لا ٨٤٠.

[٢٤] تەفسیری مقتطف لا ١٠٠٠

واتە: شەیتان و سەربازەکانی لە خراپە کاروتاوان باران وەسوەسەو دوودڵی لە ناخی ئەواندا دروست دەکەن کە زاڵ بون بەسەریاندا و هانیان ئەدەن بۆ حەرام کردنی ئەو شتانەی خوا حەڵاڵی کردووە ئەگەر ئێوە شوێنیان بکەون ئەوا هاوبەشن لەو کارە نابەجێ یەیاندا.[25] ( واخوانهم يمدونهم في الغي ثم لا يقصرون) الأعراف : ٢٠٢.

واتە: براکانی شەیتانەکان لە بێ باوەڕان شەیتانەکان زیاتر وێڵیان دەکەن و وازیان لێ ناهێنن و کەمتەرخەمی ناکەن لەو کارە ناپاکانەدا )[26]

٤ـ لە ئەنجامی بەردەوام بوون لەسەر تاوانەکان خاوەناکەیهەڵس و کەوتی نزم و کەم ڕێزی بۆ خۆی هەڵ دەبژێرێ و ڕێز و بەرزی و عیزەتی دەروونی لەدەست ئەدات چونکە نەفس و کردار و هەڵوێستەکانی پاک

---

[25] تەفسیری مقتطف لا ٣٤٠.

[26] تەفسیری مقتطف لا ٣٩٦.

نەکردۆتەوە( قد افلح من زكاها وقد خاب من دساها)
الشمس /٩-١٠

واتە: سەرفرازو و ئازاد بوئەوەی بە نەفسی خۆی گوێ رایەلی کرد ئەوەشی چاکەکانی شاردەوە ئامادەباشی چاکەی لەناوبرد دۆراو بێبەش بو لە خێرو چاکە.

٥- یەکێکی تر لە سزای تاوان بۆ خاوەنەکەی و کاریگەری بونی لەسەر هەڵس و کەوتی بریتی‌یە لە بێ بەش بوونی لەو نیعمەتانەی خوای گەورە هەیەتی یان لێ سەندنەوەی نیعمەتەکان لێی، و هاتنی تۆڵەی خوای بەسەر یا، هاوەڵێکی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەر بەلاو نەهامەتیەک هاتبێتە خوارێ بەهۆی گوناه و تاوانەوە بووە هەر بەلاو نەهامەتیەکیش لاچووبێت بە هۆی تەوبەو پەشیمانیەوە بووە). لەوبلرەیەوە ثەوری دەفەرموێت: ( پێنج مانگ بێ بەش بووم لە شەونوێژ بەهۆی گوناهێکەوە کە کردم ئینجا لێیان پرسیی ئەو گوناهە چی بوو؟ فەرمووی پیاوێکم بینی دەگریا لەنەفسی خۆمدا وتم: ئەوە بۆ ریا دەگری).[27] وە هەر نیعمەتێکی

[27] بنواره ـ أحياء علوم الدين . ٣٥٦/١.

تریش لەمەترسیدایە ئەگەر خاوەنەکەی تاوان بکات و گوێ نەدات بە فەرمانەکانی خوا.

٦ـ تاوانکار بەهۆی گوناهەوە هەڵس و کەوتی لە خێر و چاکەدا لاواز دەبێت و لە هەندێ ـ طاعة ـ گوێ رایەڵیی و جێ بەجێ کردنی فەرمانی خوادا بێ بەش دەبێت بۆ نموونە مرۆڤێک خواردنەکەی حەرام بێت یان بەرێگایەکی حەرام پەیدا ی کردبێت بێگومان لە تام و چێژی نزاو پاڕانەوە بێ بەش دەبێت وەک چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس دەکات : ( يا سعد أطبَ مطعمك تكن مستجاب الدعوة والذي نفس محمد بيده أن الرجل يقذف اللقمة الحرام في جوفه ما يتقبل منه اربعين يوماً و أيما عبد نبت لحمه من السحت و الربا فالنار اولى به).واتە: ئەی سەعد خواردنی حەڵاڵ بخۆ و دوعات لێ وەردەگیرێ سوێند بەوکەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە پیاوێک تەنها پاروویەک حەرام بخوات چل رۆژ دوعای لێ وەرناگیرێ وە هەر بەندەیەک گۆشتی لاشەی بەحەرام و ریا بازی زیاد بکات ئەوا ئاگر لە پێشترە بۆی.[28]

---

[28] کۆسپەکانی رێ بەرگی یەکەم لا ١٢.

٧ـ تاوانەکان کات و تەمەنی تاوانکار کەم بەرەکـەت و دوا براو دەکەن گەشەو سەرمایەی مرۆڤ کات و تەمەنیەتی کە دەبێت بە نەخشەی چاك و رێك بجوڵێتەوە ئەگـەر کاتـەکانی ژیـانی گەشـاوە و درەوشـاوە و چـاك بـن ئـەوا تەمـەنی هـەر ئاوەدانی و زیندوو دەبێـت و شـوێنەواری بـاش لەسـەر ژیـانی خۆی و دەوروبەری بەجێ دەهێڵێ مرۆڤیش چاك و نیەت بـاش بێت و کاتەکانی بەکارو فەرمانی باش پڕ کردبێتەوە هەمیشە زیندوەو بەمردن دوایی پـێ نایـەت ( للذين أحسـنوا الحسـنى وزيادة ولا يرهق وجوههم قتر ولاذلة أولئك أصحـاب الجنـة هم فيها خالدون * والذين كسبوا السيأت جزاء سـيئة بمثلهـا وترهقهم ذلة مـا لَهـم مـن الله مـن عـاصم كأنمـا أغشـيت و جوههم قطعاً من الليل مظلماً أو لئك أصحاب النار هم فيها خالدون). يونس :٢٦-٢٧.

واتە: ئەو بەندانەی وەڵامی بانگەوازی خواییـان داوەتـەوە بەوەی باوەڕیان هێناوە و چاکە شیان ئـەنجام داوە بـۆ ئـاین و دنیای خۆیان لە رۆژی دوایی داپلەو پایەیەکی بـەرزیان هەیـە

کە بریتییە لە بەهەشت و دەم و چاویشیان نیشانەی بێ تاقەتی و بێزاری پێوە دیاری نادات و بەهەمیشەی دەبن بەخاوەنی بەهەشت و تیایدا دەمێنێتەوە ، بەلام ئەوانەی وەلامی بانگەوازی خوایان نەداوەتەوە سەرەڕای ئەوەش بێ باوەڕبون و لە گوناه و تاواندا ڕۆچونی دەم و چاویان شەرمەزارە و ڕەنگی ڕەش بەسەریاندا زال بووە ولێو بە بارو خەم بارن چونکە دەبن بە سوتەمەنی ئاگری دۆزەخ و بەهەمیشەی بەدبەخت دەبن تیایدا .[29]

٨ـ تاوانەکان چەند زۆر بن ئەوەندە هەلوێستی جوامیرانەی ئەوبەو پاشکەز بونەوە دوور دەخەنەوە بۆ تاوانکار هەتا ویست و لێبڕانی لاواز دەبێت بەبۆنەی زال بونی تاوان بەسەریدا و دڵیشی ڕەش دادەگیرێت ( تعرض الفتن على القلوب عوداً عوداً، فأى قلب أشربها نكت فيه نكتة سوداء ...... )[30]

---

[29] تەفسیری مقتطف ـ لا٣٥٦.

[30] رواه مسلم ١٤٤.

واتە: فتنەو ئاشوب دێت بەسەر دڵەکاندا وەك چۆن تاڵەکانی حەسیرەکە یەکە یەکەی ڕەشی ڕووی تێ دەکات وهەردڵێك بیخواتەوە خاڵێکی ڕەش تیایدا دروست دەبێت.

٩ـ تاوانەکان دەرگای ئاسانی و چاکە لە خاوەنەکەی دادەخەن وە ڕوولە هەرلایەك دەنێ بۆی ناکرێتەوە هەروەها بە پێچەوانەوە دەرگا لە چاکە خوازان و لە خواترسان دەکرێتەوە و دەرفەتی خێریان بۆ والا دەبێ وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ( ومن يتق الله يجعل له مخرجا..... ) الطلاق:٢.

واتە: ئەوەی لە خوا بترسێت فەرمانەکانی جێ بەجێ بکات و قەدەغە بکات لەوشتانەی حەرام کراوە خوای گەورە دەروازەیەکی بۆ دەکاتەوە و لەهەمو تەنگ و چەڵەمەیەکدا.[٣١]

١٠ـ لە ئەنجامی بەردەوام بوون لەسەرتاوان خاوەنەکەی نرخی خۆی لا بچوك دەبێتەوە و گرنگی بەرەنجامەی تاوانی لاسادە و ساکار دەبێت پێغەمەبری خواش ﷺ دەست

[٣١] تەفسیری مقتطف لا١١٠٨

نیشانی ئەم ئاسەوارەی کردە و فـەرمووی : ( إن المؤمـن یـری ذنوبه کأنها أصل جبل یخـاف أن یقـع علیـه وان الفـاجر یری ذنوبه کذباب وقع علی أنفه فقال به هکذا فطار)[32]

واتە : باوەڕدار گوناه و تاوانەکانی وەک کێوێک دەبینــێ و خەریکە دەکەوێت بەسەری دا بەڵام مرۆڤی بێ بـاوەڕ گونـاه و تاوانەکانی وەک مشێک دەبێت کە بەلوتیەوە نوسابێت ئینجا هەڵ بفڕێ و دووریکەوێتەوە .!!

## چوارەم / لەسەر ژیانی خەڵکی و میللەت و نیشتمان.

گوناه و تاوان بەتەنها کاریگـەریان نیـیە لەسـەر نـەفس و عـەقڵ و هــەڵس و کـەوتی مـرۆڤ بـەڵکو کاریگـەرییان هەیـە لەسەر میللەت و ژیانی خەڵکی لەو کاریگەریانە:.

١ـ زۆری تاوانەکان دەبنە هۆی هاتنی سزای خـوای بەسـەر هەموو میللەتێدا بێ ئەوەی جیاوازی بکرێت لەنێوان چاک و خراپدا خوای گەورە دەفەرموێت : ( واتقـوا فیتنـة لا تُصیبنَّ

[32] رواه البخاري

الذين ظلموا مِنكم خاصة واعلموا أن الله شديد العقاب )
الأنفال : ٢٥.

واتە : خۆتان بپارێزن لە سزایەک کە بەهۆی گوناه و تاوانەوە دێت و بە تەنها ئەوانەش ناگرێتەوە گوناهەکانیان کردووە بەڵکو هەموو یان دەگرێتەوە .[٣٣] هەروەها پێغەمبەری خواش دەفەرموێت ﷺ : ( اذا أنزل الله بقوم عذاباً أصاب العذاب من كان فيهم ثم بثعوا على أعمالهم )[٣٤] واتە: کە خوا سزایەکی ناردەسەر تەومێک ئەو سزایە هەرکەسێ لە ناو ئەو قەومەدا بێ ئەیگرێ لە دواییدا هەرکەس لەسەر کارو کردەوەی خۆی زیندوو ئەبێتەوە.[٣٥]

٢ـ تاوانەکانی تاوانکار ئەستۆی ئاژەڵ و گیانداران و روەکیش دەگرێتەوە ئەوەتا موجاهید دەفەرموێت : (گیانداران

[٣٣] تەفسیری مقتطف بەدەستکاریەوە لا ٣٠٤.

[٣٤] أخرجه البخاري

[٣٥] بنوارە أقتان النورين في مجمع البحرين بەرگی ٣/٦٤ بەدەستکاریەوە.

نەفرین لـە تاوانکـارانی ئـەوەی ئـادەم دەکـەن چونکـە ڕۆزی و بارانیان لێ کەم دەبێتەوە هەروەها عەکرەمە دەفەرموێت:

سیسرک و دووپشکەکان دەڵێن: تاوان و خراپەکانی ئـەوەی ئادەم نارەحەتی کردووین دەرامەتیان نەهێشتووین.

٣ـ بەهۆی تاوانەکانەوە ڕێساو یاسای کۆمەڵگەو بوونـەوەر تێک دەچێـت و ژینگـە و بـارودۆخ و ئـاو هـەوا دەشـێوێت و ئاوەدانی و وڵات و پەیوەندیەکانی لەسەر ڕچەی خۆی نامێنێ و پێناسەی هەق و ناهەق دەگـۆڕێ ( ظهـر الفسـاد في البر و البحر بما كسبت أيـدي النـاس ليذيقهـم بعـض الـذي عملـوا لعلهم يرجعون). الروم -٤١

واتە قات و قـڕی و بـەڵاو برسێتی تیـاچوونی بازرگـانی و مامـەڵە سەری هەڵدا لەسەر زەویی دا بەهۆی گونـاه و تـاوانی خەڵکی یەوە خوای گەورەش سزای خەڵکی ئەدا لە دونیـادا بـەهۆی کردەوەی خراپ و تاوانیانەوە بەڵکو پاشگەزببنەوە...[٣٦]

---

[٣٦] تەفسیری مقتطف ـ لا ٧٦٩.

٤ـ یەکێکی تر لە سزاکانی تاوانکردن ئەوەیە پێشەوای راستەقینە وون دەبێت و کەسێکی پیس و گەندەڵ بۆ خەڵکی دەسازێت چونکە فریشتەکان هەمیشە دوردەپەرێزن لەو جۆرە کەسانەو کۆمەکیان ناکەن، و پێشەنگێکی خراپ دێتە مەیدانەکەو لە بێ ئەمانەتی بەڕێوە برانی خەڵکی ناگەیەنێتە مەنزڵ جارێکیان پیاوێک پرسیار دەربارەی کاتی رۆژی قیامەت دەکات لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش دەفەرموێت (اذا اضيُعت الأمانة فانتظر الساعة ) واتە: کاتێک ئەمانەت و سپاردە لە ناوچوو چاوەڕێی قیامەت بە پیاوەکە جارێکی تر دەپرسێتەوە : کەی ئەمانەت و سپاردە لەناو دەچێت پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: ( اذا ولی الأمر الی غير أهله فانتظر الساعة)[٣٧]

واتە: کاتێک کاروباری خەڵکی کەوتە ژێر دەستی کۆمەڵێک شایستەنەبوو ئەوسا چاوەڕێی هاتنی قیامەت بە.

---

[٣٧] رواه البخاري.

**پێنجەم/ کاریگەری لەسەر پاشەڕۆژ یان قیامەتی مرۆڤ.**

سامناکترین ئاسەوارێک گوناه و تاوان بەجیٚ ی دەهێڵێ لەسەر ژیانی قیامەتی ئادەمیزادە چونکە لەو ڕۆژەدا بە تەنها کرداری چاکە فریای مرۆڤ دەکەوێت ئەگەر کرداری چاکەشی نەبێت ئەوا سزاو غەشم و قین ئەستۆی دەگرێتەوە لەو شوێنەوارانەش چەنددانەیەکیان لیٚ باس دەکەین:

١ـ تاوانکار بەهۆی خراپەکانیەوە بیٚ بەش دەبێت لە بەزەیی و سۆز و لێبوردنی خوای گەورە و ڕیسوایی و سوکایەتی چاوەڕێی دەکات بەتایبەت ئەگەر ژیانی بەو شێوەیە دوایی پیٚ بێت ئەوسا ملکەچ و لێو بەبار دەبێت و کەسیش ناتوانێت بێت بەهانایەوە (ومن يهن الله فما له من مكرم) الحج /١٨.

واتە : هەرکەسێک پەروەدگاری نزمی و سوکایەتی بیٚ بکات و دەری بکات لە سۆز و بەزەیی خۆی کەس نیە ڕێزی لیٚ بگرێت .[٣٨]

---

[٣٨] تەفسیری مقطتف ـ لا ٦٠٨

٢ـ تاونكاران بەهۆی گوناه و تاوانەكانیانەوە ژیانێكی سەخت و نارەحەت دەبەنەسەر لە سەرەمەرگ و ناو گۆڕو قیامەتدا و لە ئەنجامی ئەو تاوانانە سزایەكی سەخت و گرانیان بۆ ئامادەكردوە كە بەم شێوەیە یە:

ا. لەسەرمەرگدا فریشتەكان ئازارو ئەشكەنجەی ئەدەن: (ولو ترى اذيتوغبیْ الذين كفروا الملائكة يضربون وجوههم وأدبارهم ذوقوا عذاب الحريق) الأنفال :٥٠.

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر دەبینیت چۆن ئەو سزا سەختە دێت بەسەرئەو بێ باوەڕانەدا كاتێك فریشتەكان گیانیان دەكێشن چۆن رۆحەكەیان بە توندی كێش دەكەن و لەگەڵ ئەوەدا دەكێشن بە دەم و چاویشیاندا و پێیان دەڵێن : بچێژن سزای ئاگر بەهۆی كرداری ناپاك و خراپ تانەوە.[٣٩]

ب. لە گۆڕدا فریشتەكان بەفەرمانی خوای گەورە ئازاریان دەدەن: ( ياأيها الذين آمنوا لا تتولوا قوماً غضب الله عليهم

[٣٩] تەفسیری مقتطف ـ لا ٣١٠.

قد يئسوا من الآخره كما يئس الكفار مِن أصحاب القبور ) . المتحنة /١٣.

واتــە: ئــەی ئەوانــەی باوەڕتــان هێنــاوە بــە بــەخواو پێغەمبەرەکەی پشتگیری نەتەوەیەک مەکــەن بــێزارن لــە قیامەت و ئەو لێپرسینەوەیەی هەیە وەک چۆن بـۆ باوەڕان بێزارن لە هاوەڵانی گۆڕ.[40]

هەروەها پێغەمبەری خواش ﷺ سەبارەت بە سزای نـاو گۆڕ بـۆ خراپەکاران دەفـەرموێت : ( العبـد اذا وضـع في قـبره وتولى وذهـب أصحابه حتى أنـه يسـمع قـرع نعالهم ، أتاه ملكان فأقعدان. فيقولان له: ما كنـت تقـول في هـذا الرجـل محمد ﷺ ؟ فيقـول : لا أدري كنـت أقـول مـا يقـول النـاس . فيقال : لا دريت و لا تليت. . ثم يضرب بمطرقة مـن حديـد ضربة بـين أذنيـه، فيصبـح صحيحـة يسـمعها مـن بليـه الاالثقلين) [41]

---

[40] تەفسیری مقتطف ـ لا ١٠٩١.

[41] الصحيح البخاري ٣/١٠٨.

واتە: کاتێک بەندە خرایە ناو گۆڕ و هاوەڵ و کەس و کاری بەجێیان هێشت گوێی لە ترپەی قاچیانە ئینجا دوو فریشتە دێن بۆ لای و سەبارەت بە پێغەمبەری خوا پرسیاری لێ دەکەن بەڵام نازانێت وەڵام بداتەوە و دەڵێ: نازانم منیش خەڵکە چی دەڵێت وام وت، ئەوانیش ـ فریشتەکان ـ پێی دەڵێن: نەدزانی وەڵاممان بدەیتەوانێ پاشان بە چەکوشێکی ئاسنین دەکێشێن پیایدا نێوان هەردوو گوێی و هاوار دەکات هەموو بونەوەر گوێ بیستی دەبن جگە لە مرۆڤ و جنۆکەی زیندوو..

ج. لە کاتی زیندوبونەوەدا: هەرکە لە گۆڕەکان دێنە دەرێ ئاسەواری گوناه و تاوان پیایاندا دیاری دەدات و و لە تاوا هاوار دەکەن.

( أن تقولوا نفسٌ يا حسرتا على ما فرطت في جنب الله وان كنت لمن الساخرين) الزمر: ٥٦. واتە داخی گرانم بۆ ئەوەی لە کیسم چوو لە گوێ رایەڵی خوا ئەمەندە سەرگەردان بووم لە دنیادا گاڵتەو گازندەم دەکرد بە ئاینەکەی.....).[٤٢]

---

[٤٢] تەفسیری مقطتف ـ لا ٨٩٥.

پاشان نیشانەی تـاوان بـە سیماو رووییاندا دیـاری ئـەدات (... فأما الذين اسودت وجوههم أكفرتم بعد إيمانكم فذوقوا العذاب بما كنتم تكفرون). آل‌عمران: ١٠٦.

واتە:سـیماو رووی بـێ بـاوەڕان رەش دادەگرسێت و غـەم باری و بێزاری لێیان جیانابێتـەوە پێیـان دەوترێـت ئـەوە بـێ باوەڕبون دوایی باوەڕهێنان و گوێ رایـەڵی دەی بچێـژن سـزای سەخت لە ئەنجامی بێ باوەڕی و سەرکەشیتان.[٤٣]

د. لە کاتی وەرگرتنی نامەی کردارەکان و بەرێ کردنـی بـۆ دۆزەخ : بەدەستی چـەپ وەری دەگرێـت و بـە رووی‌تاوانبـارو جەستەی گوناهکاریەوە بەرێ دەکرێت بەرەو دۆزەخ ئینجا فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخو ئاگری کلپە داری دۆزەخ ئەستۆی دەگرێ : ( وترى المجرمين يومئذٍ مقرنين في الأصفاد * سرا بيلهـم مـن قطـران و تعشـى وجوههـم النـار *). ابراهيم /٤٩ ـ ٥٠.

واتە: رۆژێ دەبێ بێ باوەڕان بەستراونەتەوە بە کۆت و زنجـیر لەگـەڵ شـەیتانەکانی هاوەڵیـان پێسـتەکانیان

[٤٣] تەفسیری مقتطف ـ لا ١٠٩.

بە قەتران رەش کراوە و ئاگریش بەربوە لە روویان و دەیان سوتێنێ.[44]

٣ـ لە بیرکردنی مرۆڤ بەیەکجاری لە لایەن پەروەدگارەکەیەوە و گوێ نەدان بەھاوار داواکاریەکانی : (فالیوم ننساهم کما نسو لقاء یومهم هذا وما کانوا بآیاتنا یجحدون) الأعراف : ٥١.

واتە: ئەوانەی شوێن ئارەزووی خۆیان کەوتن و خۆیان ئامادە نەدەکرد بۆ ئەم رۆژەو دژایەتی بانگەوازی خوایان کرد و رۆژی دواییان لە بیر کردبوو ئەمرۆ لە بیریان دەکەین وەک چۆن ئەوان بەربەرچی بانگەوازی راستیان دایەوە لە دۆزەخ دا دەیان سوتێنن.[45]

---

[44] تەفسیری مقتطف ـ لا ٤٥٣.

[45] تەفسیری مقتطف – لا ٣٦٣.

**دوا وتە لە دوایی خستنە رووی ئەم ئاسەوارە سامناك و خراپانە.**

خوێنەری بەڕێز دوایی ئەوەی ئاسەوارەکانی تاوان و گوناه مان خستە روو بۆت روون بویەوە کە تاوان و گوناه چەن قێزەونن و خاوەنەکەی چۆن دەبەن بەناخی زەوی دا ئەگەر فریای خۆی نەکەوێت و خۆی دەرباز نەکات بە تەوبەیەکی پاك پوخت کەواتە دەبێت هەریەکەمان رووبکاتە نەفسی خۆی و پێی بڵێ: نەفسە بەدخوەکەم .....

وازم لێ بهێنە بانەبم بەفتنە بۆ خەڵکی تر و تاوان و گوناهم پێ ئەنجام مەدە با نەبمە جێگەی غەشم و قینی پەروەدگارەکەم، با سبەینێ لە گۆڕەپانی قیامەتدا ئارەقی شەرمەزاری دەرنەدەم و بەدەستی فریشتەکانەوە نەبرێم بۆ دۆزەخ...

**نەفسەکەم.....**

دوێنێ و ساڵانی رابردوت دەشێ لە گوناه و تاواندا بەسەر برد بێت بەڵام هیچت لێ سەوز نەکرد جگە لە غەم و پەژارە و رەوشت و هەڵوێستی ناشیرین نەبێت سادەی ساتێک لێم بگەڕێ با خۆشەویستی گرێ بدەم لەگەڵ پەروەدگارەکەم داو خۆم بخەمە ناو ئامێزی سۆز و بەزەییەوانێ و سەرفرازی هەردوو دنیا بم و خزمەت بە خۆم و کەس و کارو میللەت و نیشتمانم بکەم.

## بە کۆمەکیی خوا تەواو بوو

## وآخرودعونا أن الحمد لله رب العالمين

## سەرچاوەکان


١. تەفسیری مقتطف ............... مصطفی خرم دل

٢. تەفسیری نامی ........ مامۆستا عبدالکریمی مدرس

٣. چەند کتێبێکی فەرموودە.........................

٤. دیوانی ئیمامی شافیعی ..............................

٥. تزكية النفوس ............... جمع وترتيب أحمد فريد

٦. الداء و الدواء أو الجواب الكافي لمن سئل عن الدواء الشافي.................................. لابن قيّم.

٧. الرقائق ................... محمد أحمد راشد

٨. إحياء علوم الدين .................. للإمام الغزالي

٩. ترتيب قاموس المحيط ..........................

١٠. مفردات الفاظ القرآن .........لراغب اللأصفهاني

١١. الفوائد ............... للإمام بن قيّم الجوزيه

١٢. منهج اللأستعفاف ...............................

١٣ . تهذيب مدارج السالكين ...........لشيخ الهروي ........................ و تحقيق عبدالمنعيم صالح.

١٤. کۆسپەکانی رێ.... دکتۆر محمد سید نوح ................................ وەرگێڕانی : رزگار کریم.

# پێرستی بابەتەکان

**ناوی بابەت** | **لاپەرە**